قەڵەمکێش و تابلۆی سەر بەرگ:

قەرەنی جەمیل

**ژمارەی داهاتوو:**

مەم و زینی ئەحمەدی خانی


سەرپەرشتیاری گشتی: دڵشاد عەبدوڵڵا

ستافی ڕۆڤار: یاسین عومەر / سەباح ڕەنجدەر

دەرهێنەری هونەری: حەمید ئازموودە

ڕۆڤار : بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە/ هەر ژمارە تایبەتە بە داهێنەرێک

ناونیشان: هەولێر -شەقامی گوڵان-دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

سلێمانی -شەقامی سالم -دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم



ژمارەی تەلەفۆن سەرپەرشتیاری گشتی :

کۆرەک: ٠٧٥٠٤٥١٢٧٨٦ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٣٢١٤٥

Email:d.abdullah@araspress.com

# ژیاننامەی مەحوی

بنووسە، پیری دڵم نەمری کرد، نیتاعەم کرد
لە نیبتیداوە کە بەیتێ موناسبی دیوان
گەدایەکی وەکو "مەحوی" قەلەندەرێکی کورد
میسالی پادشەهی فورسە، ساحێبی دیوان

(مەحوی بەرهەمی سەردەمێکە کە لەبارەی سیاسیو کۆمەڵایەتییەوە بۆی بڕوانی، دەبینی میرنشینی بابان لەناو چوو بوو، ئەو چەکەرەی کەسایەتی سیاسی کوردە کەچاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرا لەناوچەی باباندا سەوز بێو پێ بگاو شتێکی نوێی لێبێتە بەرهەم، پووکابووەوەو وشک بوو بوو، تا پاشان تۆوێکی لێبەجێ بمێنێ سەر لەنوێ لەزەمینەی نیشتماندا شێ هەڵمژێو بەشێوەیەکی تر سەوز ببێتەوەو شتێکی تازەی بەرگە گرتووتری لێبێتە بەر.
هاتنی عوسمانییەکان بۆ ناوچەکەو ئەو گۆڕانە کۆمەڵایەتییەی بەسەر سلێمانییاندا هێنابوو، بارێکی نوێی بیرو ژیانی هێنابووە ئاراوە. لەئەنجامی ئەوەوە دەزگای نوێی میری، پەیوەند لەگەڵ ژیانی نوێ، کولتووری نوێ، خوێندەواری نوێ، بازرگانی نوێ، باری نوێی چینایەتی، تا رادەیەکی بەرچاوکەوتوو پەیدا بوو بوو، ئەو هەرایەی کەتازەبوونەوەی تەریقەتی نەقشبەندی لەکوردستانی خوارووا نایەوەو بەربەرەکانێو کێشەی توندو تیژی نێوان نەقشبەندیو قادریو دەسەڵاتی زۆری تەریقەتی قادری لەناو شاری سلێمانیدا لەشەخسی بنەماڵەی شێخانی بەرزنجەدا کەسەییدو ئەولادەی پێغەمبەر بوونو بەپێچەوانەی ئەوەوە دەسەڵات پەیداکردنی تەریقەتی نەقشبەندی بەسەر بەشێ لەلادێکانی ناوچەی دەوروپشتدا لەڕێگەی خەلیفەکانی مەولاناوە پاش هەڵاتنی مەولانا خۆی بۆ بەغداو شام، کەمەولانا خۆیشی کوڕی کابرایەکی نەناسراوی جافی مکایەلی بوو، هەروەها موتوربەبوونی تەریقەتی قادری لەگەڵ

دەسەڵاتی دەرەبەگییانەو هاتنە ئارای بەکارهێنانی دەسەڵاتی ئایینی بۆ سوودی دنیاییو هەوڵی زۆرو بەتینی عوسمانییەکانیش بۆ سرکردنی مێشکو بیری خەڵکو هەڵخڵەتاندنو خلافاندنیان لەرێگەی پشتیوانی کردنی بیری سۆفییەتیو دەرویشییەوە، کە لەو هەموو دەس گرۆیی کردنەی شێخەکانو تەکیەو خانەقا بۆ کردنەوەو مووچەو مانگانە بۆ برینەوەیاندا دیاریدەدا... ئەمە هەمووی نەخشەیەکی ئەو بارە کۆمەڵایەتیەمان پیشاندەدات کە مەحوی تیا هاتە دنیاوەو پێگەیشت..)

(مەحوی هەم باوکی خەلیفەی شێخ عوسمانی تەوێڵەی جێنشینی مەولانا خالیدی نەقشبەندی شارەزووریو هەم خۆیشی خەلیفەی شێخ ((بهاء الدین))ی کوڕی شێخ عوسمان بووەو هەم لە خۆشیدا سەرەڕای بەهرەی شاعیریەتەکەی خاوەنی نەفسێکی یاخی و شۆڕشگێڕ و دەروونێکی سەرکەش بووە و لەسلێمانیشدا ژیاوە، کەمەیدانی ئەو هەموو ناکۆکیو زۆرانبازییەی نێوان حەقو ناحەقو زوڵمو داد بووە).

محەمەدی مەلا کەریم لە پێشەکی دیوانی مەحوی ـ دا کە لەگەڵ بەهەشتی باوکییدا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس ئامادەیان کردووە و لێکدانەوەیان بۆ شیعرەکانی کردووە و لە ساڵی ١٩٧٧ لەلایەن کۆڕی زانیاری کورد لە بەغدا چاپ کراوە، بەم شێوەیەی سەرەوە باسی ئەو سەردەمە دەکا کە (مەحوی) تێدا ژیاوە.

محەمەد مەلا عوسمان باڵخی لەساڵی ١٨٣٠زایین لە سلێمانی لە دایک بووە. هەندێک لە نووسەران دەڵێن ١٨٣١-١٨٣٢ یان ١٨٣٦-١٨٣٧ زایین ساڵی هاتنە دنیایەتی.

بەهەشتی عەئەدین سەججادی لە (کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی)یەکەیدا وا باسی بەشێکی ژیانی مەحوی دەکا:

(لەتەمەنی حەوت ساڵیدا خراوەتە بەر خوێندن، لە کتێبە وردەڵەکان بوەتەوە و سەرەتای خوێندنی عولوومی ئیسلامیی لای باوکی دەست پێ کردووە، لەپاشا بە فەقییەتیی چووە بۆ سابلاخ و بۆ لای مەلا عەبدوڵڵای پیرەباب، سێ ساڵێک لەوێ ماوەتەوە، گەڕاوەتەوە بۆ سولەیمانی، لەو ناوەدا و لە لای مەلا چاکەکانی ئەو دەورەدا گەلێ دەرزی وەرگرتووە، ئینجا چووە بۆ بەغدا بۆ لای مفتیی زەهاویی. ماوەیەک لەلای زەهاویی ماوەتەوە و ئیجازەی مەلایەتیی پێ داوە و لە ١٨٥٩دا کردوویە بە مامۆستای مزگەوتی ئیمام ئەعزەم، لە ساڵی ١٨٦٢دا بەغدای بەجێ هێشتووە و چووەتەوە بۆ سولەیمانیی. لە سولەیمانیی بووە بە ئەندامی مەحکەمە. لە ١٨٦٨دا کە باوکی ئەمرێ، خۆی لە ئیشی حوکوومەت ئەکێشێتەوە و دەست ئەکا بە دەرز وتنەوە بە فەقیان. مەلا وەسمانی باوکی خەلیفەی شێخ سیراجەددینی تەوێڵە بووە. خۆیشی هەر لەو بنەماڵەیەدا خەلیفەیەتیی شێخی بەهائەددین وەرئەگرێ. لە دوو لاوە بە دوو لادا مەردم فێری عیلم و تەسەووف ئەکا...

لە ١٨٨٣دا بارگە ئەپێچێتەوە ئەچێ بۆ حەج. هەر کە لە حەجەکەی ئەبێتەوە لەوێوە ئەچێ بۆ ئەستەمووڵ. پیاوە کوردەکان ئەیگەیەنن بە سوڵتان عەبدولحەمید. سوڵتان شێخ موحەممەدی بە عیلم و تەسەووفەوە ئەچێتە دڵەوە، نەوازشێکی زۆری لەگەڵا ئەکا و فەرمان ئەدا لە سولەیمانیی خانەقایەکی بۆ دروست ئەکەن - کە بەناوی خانەقای مەحوییەوە ناوبانگ ئەسێنێ و ئێستەش ئەو خانەقایە ماوە. کە ئەگەڕێتەوە بۆ سولەیمانیی ئیتر دەست ئەکا بە دەرز وتنەوەی عیلم و ڕابەریی کردنی مەردم لە باری تەسەووفدا، تا لە ١٩٠٤ای میلادیی لە تەمەنی ٧٣ ساڵیدا شەربەتی مردن ئەخواتەوە و لە خانەقاکەی خۆیدا ئەنێژرێت.

شێخ موحەممەد پیاوێکی باڵا بەرز و کەڵەگەت، سوور و سپیی و چاو گەورە و ڕیشێکی درێژی پێوە بوو، بە نەرمیی و لەسەرخۆ قسەی کردووە. مێزەری سپیی کوردانەی لەسەر ناوە و کەوا و سەڵتە و جوبەی لەبەر کردووە. لە دەوری ئاخردا ژوورێکی لە خانەقاکەی خۆی بۆ خۆی تەرخان کردووە لەوێدا وەختی کردووە بە سێ بەشەوە، بەشێکی بۆ دەرز وتنەوە، بەشێکی بۆ دانیشتن لەگەڵ مەردما و ئامۆژگاریی کردنیان لەباری شێخایەتیی، بەشێکیشی بۆ نوێژ و زیکر و فیکر. لە سەرەتای ژیانیشیەوە زۆرتر حەزی بە گۆشەگیریی و تێکلا و نەبوون کردووە و لای وابووە کە سووسەی نەسیمی مەعنەویات لەم سووچەوە دەست ئەکەوێ. کە ماوەیەک ماوەتەوە و بۆنی هیچی نەکردووە، کەوتووەتە سەر ئەو باوەڕە کە تا جۆش و خوروشێکی نەبێ ناگاتە ڕووی ئازیزان، بە خۆی ئەڵێ:

**سەر کە جۆشێکی نەبێ، من زرکە تاڵم بۆ چییە!**
**دڵ کە هۆشێکی نەبێ، شیشەی بەتاڵم بۆ چییە!**

پێی ئەڵێن ئەم جۆش و خورۆشە ئەتکێشێ بۆ لای ئەو مەیدانە کە مەیدانی عەشق و عاشقانە و مەیدانێکی ترسێنەرە، مەیدانێکە کە سەرچاوەی ئیلهاماتی شیعر و ئەدەبە. بازاڕی

شیعریش گەلێ لقی لێ ئەبێتەوە. ئەڵێ:

**ئەزانم بادیەی عیشقە خەتەرناک**

**کەچی هەر چووم، ئەگەر ماوم، ئەگەر چووم**

کە ئەکەوێتە ئەو مەیدانەوە، بە بێ ئیختیار شەرابی عیشقی شاعیران ئەخواتەوە و "مەحوی" ئەکا بە ناوی شیعریی).

هەروەها لەبارەی بەرهەمەکانی (مەحوی) یان هەندێکجار نازناوی(مەشوی)بۆخۆی هەڵبژاردووە، سەججادی دەنووسێ: (مەحوی ڕاستە بە فەلسەفە پەرستیی و دەرویشیی و عیبارەت ڕێکخستنەوە خەریک بووە، بەڵام لە بن دەست ئەمەشەوە لایەنی قسەی نەستەق و حیکەمییاتی بەرنەداوە، بەڵکو لەم بابەتەوە گەلێ باڵاتر و قسەکانی بۆ دانسقە ئەشێن... لەبابەت ئەوەوە کە هەروا وەکو نقوم بووی سەر پارچە تەختە ماوەتەوە، ئەڵێ

**چبکەم نە ئەو کەسەم کە کەسم بێ لە لا بە کەس**

**خۆیشم نەگەیمە ئەو کەسەی من بکا بە کەس**

دیارە پارسەنگی کۆمەڵایەتیی چاک چاک هەڵسەنگاندوە، بۆیە ئەڵێ:

**نامەرد ئەوەندە موعتەبەرن لەم زەمانەدا**

**مەرد ئیعتیباری کەم بووە، مەردی خوا خوسوس!**

دیسان ئەڵێ:

**لە هەموو جیی لە چ کەس بێنی مرووەت نایە**

**کەرەم و سیدق و وەفا ئێستە لە عالەم بوە قات!**

**ئای چەند جوانە ئەو شیعرەی کە ئەڵێ:**

**زەمانەی پڕ تەعەب دەتکاتە تیرۆک**

**لەتێ نانت ئەداتێ دوو بەشی تۆک**

**لەباری زوهددا ئەڵێ بەڵام بە جیناسەوە:**

**دنیا تیاترۆیە مەوەستە تیا، بڕۆ**

**کێ مایەوە تیا، کە نەبووبێ تیا تڕۆ!**

بە دوو بەیت فەلسەفەی دوو ڕێ گر دەرئەخا، هەرچەندە فیکرەکە گەلێ پێش مەحوی کەوتووە، چونکە "مەعەرڕیی" و "خەییام"یش قسەیان لێوە کردووە، بەڵام نرخی مەحوی لەمەدا بەوە دەرئەکەوێ کە بە شوێن بیروباوەڕی فەلسەفەچییەکانی پێشوودا گەلێ سووڕاوەتەوە و ویستوویەتی ئەدەبییاتی کوردیش لەو جۆرە شتانە بێ بەش نەبێ، بۆیە هاتووە بەو دوو بەیتە جوانەی ئەو قسەیە ئەکا کە ئەڵێ:

**شێخی هەمەوەندێکی ئەدا وەعز و نەسیحەت**

**ئەو قورپەسەرەی دابوە بەر فەحش و فەزیحەت**

**خۆش هاتە جواب و وتی: تۆ حەقتە فەقەت من**

**قوتتاعی تەریقم، نەکو قوتتاعی تەریقەت**

مەحوی بڕە شیعرێکی هەیە لە ژێر ناوی (قەسیدەی بەحری نوور) کە عیبارەتە لە ١٢٣بەیت شیعر، سەرەتای ئەکاتەوە ئەڵێ:

**(وصلی اللە علی) ئەو بەحری نووری عیلم و عیرفانە**

**کە دەرکی غەوری ناکا غەیری (علم اللە سبحانە)**

لە شیعری چواردەمدا ئەڵێ:

**لە زوڵماتی شەوی کوفرا بە یەکدەم لەمعەیێکی دا**

**هەزار و سێ سەد و بیست و دووە دنیا چراخانە**

بەڕاستی چاکتر شیعر گەلێکن کە لە وەسفی بارەگای موحەممەد و عەشقی موحەممەددا وترابێ.

مەحوی وەکو چۆن لە کوردیدا شاعیر بووە، لە فارسیی و تورکیی و عەرەبیشدا هەر بەو جۆرە ئامادە بووە. دیوانە کوردییەکەی بۆ جاری یەکەم لەلایەن (عەلی کەمال باپیر)ەوە لە ساڵی ١٩٢٢ی میلادیی لە چاپخانەی حوکوومەت لە سولەیمانی لەچاپ دراوە).

دیوانەکەی مەحوی چەند جارێک چاپکراوەتەوە و لە هەر چاپێکدا چەند شیعرێکی دۆزراوەی تێییدا زیاد کراوە. دەوڵەمەندترین چاپی ئەو چاپەیە کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد ئەویش بە چاپەکەی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس ناسراوە. ئێمەش ئەم دیوانەمان کردۆتە سەرچاوە لە دامێنی هەر شیعرێکیشدا لاپەڕەکەمان دەستنیشان کردووە.

لە ڕووی شێوازەوە شیعرەکانی دەچنەوە سەر قوتابخانەی نالی، شێوە زمانی ئەو قوتابخانەیە تاکو ئێستا درێژەی هەیە.

مەحوی لە زۆربەی پیتەکاندا شیعری بەرهەم هێناوە کە کۆی شیعرەکانی بریتین لە (١٣٢) پارچە شیعربە کوردی، ٤٨ پارچە چوار خشتەکی و ١٦ تاک دیڕیش ئەوانیش بە کوردی، لەگەڵ پێنج قەسیدەی درێژ لە ستایش و عەقیدە بەکوردی، شیعرێک بە زمانی عەرەبی، ٧٥ شیعری فارسی، چەند تەخمیس و دوو بەیتی فارسی کە هەمووی دەکاتە نزیکەی ٢١٠ پارچە شیعر بە (کوردی و فارسی و عەرەبی)یەکانییەوە.

ڕۆڤار

بەجێ نایێ، دەبێ ڕوو کەینە سارا
حەقی ئادابی مەجنوونی لە شارا
کە چەرخ ئەسکەندەری دی دەردەدارە،
وتیی: ئەم هەم بووە هەم دەردی دارا
هەتا حەق ناسیرە، هەر حەقمە مەنزوور
وەکوو مەنسوور ئەگەر بمکەن بە دارا
نەگەیمە ئەو جوانە و گەیمە پیری
مەدەد یا پیری پیرانی بوخارا
لەبەر زار و نەزاریی بوومە وەک پووش
دە ئەمجا ڕابوێرە من بە زارا
مەگەر تۆ عەرزی حاڵم کەی لە کن یار
قەڵەم، ساغی قسە: من نیمە یارا
لەڕم دیی زاهید ئەم زستانە، زانیم
کلک نادا بە زڕپنگی بەهارا
وەرە دەستێ بە خوونم کە نیگارین
خوێنی من حەڵاڵت بێ، نیگارا!
زوو ئەو شۆخە لە عاشق وەردەچەرخێ
لەگەڵ کەس، چەرخە ئەو، ناکا مودارا
موژەی خوێنێ دەکا هەر لەحزە، سەیرە!
ئەمەندە گوڵ لەبن یەک نووکە خارا
کە شک بەم (مەحویا) هەر شەربەتی مەرگ
لەسەر ئەرزا نییە ئاوی گەوارا

ل: ٧

تێبینی: شیعرەکان لە دیوانی مەحوی ئامادەکردن و لێکدانەوەی مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس و محەمەدی مەلاکەریم وەرگێران، تەنیا پەنجە بۆ لاپەڕەکانیان درێژ کراوە.

دیارم دەیری عیشقە، جێ بەسووتن بێ لەوێ دەگرم
کەمن مشتێ چڵو چێوم، بەچیی بم، کەڵکی کێ دەگرم
نەگەییە دامەنی دەستی دوعا، جا دەبمە خاکی ڕێی
تەریقەی گۆشەگیریی بەردەدەم، ئەمجارە ڕێ دەگرم
کەدادی یەئسی خۆمم بردە لا، ئەم عارفە توند بوو
وتی: ئاخر سبەینێ جەژنە، خوێنی تۆ لەپێ دەگرم
لەڕووسووری عیبادەت لامو روو زەردی خەجاڵەت مام
بەناوی سێوی ناوم باغەوان‌و من بەهێ دەگرم
لەسەرخۆچوونە، شەیدا بوونە، قوڕ پێوانە، سووتانە
هەتا مردن، مەحەببەت ئێشی زۆرە، ڕێزی لێ دەگرم
چ شۆخە ئاگرم تێ بەردەدات‌و پێم دەڵێ: یا شێخ!
بەخاشاکی دەوت شوعلە عەسامە، دەستی پێ دەگرم
کە سینەی ڕێشمی بەو تێغی نازە ئەنجن ئەنجن کرد
وتی: پەژموردەیە ئەم لالەزارە، ئاوی تێ دەگرم
لەپاداشی قسەی سەردا هەمە ئاو‌و هەناسەی گەرم
کەسێ شێتانە بەردم تێ گرێ، من بەرقی تێ دەگرم
شوکر هۆشیارە((مەحوی))، تێدەگا دنیا خەراباتە
کە بەدمەستی بکا ئەهلی، خراپەی بۆچی لێ دەگرم!

ل: ٢١٧

لەناکەس کارییا، خاکم بەسەر، ڕۆیی بە با عومرم
خودا! تۆ بمژیێنە تا لەبەر قاپی کەسێ دەمرم
بەزایع چوو لە((ما لا یعنی)) یا وەقتم هەموو، یەعنی...
دەبێ وەقتێ لە((بوالوقت))ێ بخوازم دا تیا بمرم
ئەجەل دەورم دەدا: حازر بە، وادەی دەور و تەسلیمە
منی غەفڵەت زەدە هێشتا خەریکی مەسئەلەی دەورم
خەیاڵی پووچی دنیا وا دەماغو دڵمی پێچاوە
قیامەت، هەر مەگەر ڕۆژی قیامەت بێتەوە فکرم
لەپێ کەوتوومو نەفسم بۆ هەوا دەشنێ وەکوو منداڵ
لەبەر پیری سەرم خۆی ناگرێتو تازە پێ دەگرم
چییە سووچو گوناهی؟ بۆچی دەیکاتە جەزاخانە؟
لەقەبر هەڵکەن، هەتا ڕۆژی جەزا دەعوا چییە قەبرم
سبەینێ((یحشر المرء))ە، برا گەل فرسەتە ئەمڕۆ
تەبەڕڕا بن لەمن، باکەس نەبێ حەشری لەگەڵ حەشرم
لەمن نازانم ئیتر نەفسی بەدخوو چی دەوێ((مەحوی))
کە بەد کردارو بەد ڕەفتارو بەد ئەفکارو بەد تەورم
مەگەر بەر مەوجی بەحری رەحمەتم خا وەسفی سەتتارییی
وەگەرنا زەحمەتە پا بوونەوەم، نا مومکینە سەترم

ل: ٢٢٠

موحەققەق هەر کەسێ مەسلەکیە حەقق‌و حەققیە مەنزوور
سولووکی چوونە سەر دارە، تەریقەی پیریە مەنسوور
لەئولکەی عیشقەدا بۆ هەرکەسێ سەرداریە مەنزوور
عولووی مەرتەبەی سەر دارە، بۆتە پەیڕەوی مەنسوور
دەڵێ دانامو دڵ خۆشی دەخاتە داوی زوڵف‌و خەت
ئەگەر عەقڵی هەیە بۆچیی حەزەر ناکا لەمارو موور!
کەمالات‌و مەعاریف مەبیە، بێ دەخڵی هەوێنی عیشق
عەجەب پشکووتووە لەم جەزوە نارە پڕ بە عالەم نوور
بەخوێنم تینووە، با نۆشی کات‌و نۆشی بێ، ئەمما
لەسەر چیی، تۆ بڵێ ئەو لێوە مۆرە وا لە من بوو سوور
ویسالت نارە، هیجرت رۆژە رەش، وەک ئافتابی تۆ
لە تۆ نەزدیکە پشکۆیە، خەڵووزە گەر لە تۆ بێ دوور
تەعەججوب گرتمی، سۆفیی کە تەسبیحم لە ملیا دیی:
کە بێ تەقریبە پیر ێژن لەبەریا بێ بەرو بەرموور
بەزەردو سووری دنیا زەردەواڵەت لێ نەگۆڕابێ
بەهەنگی تێبگەی، هەر نێشە، نۆشێکی نییە زەنبوور
لەتێغی تۆ هەتا((مەحوی)) شەرەفیابی شەهادەت بوو
خوێنی بوو بە ئاو، ئیتر لە داوێنت نەما مەحزوور

ل: ١٢٧

بەنووری بادە کەشفی زولْمەتی تەقوا نەکەم، چ بکەم!
بە شەمعێکی وەها چاری شەوێکی وا نەکەم، چ بکەم!
لە خەزنەی دڵمدا هەرچیی هەیە، هەر داغی سەودایە
دەسا ئەم نەقدە دەردی عیشقی پێ سەودا نەکەم، چ بکەم!
لەگەڵ دەستی مەلا ڕێ ناکەوێ زوننارى زولفی یار
وەکوو((شێخ)) ئیختیاری مەزهەبی((تەرسا)) نەکەم، چ بکەم!
لەڕێی ئەو شۆخەدا خۆم کردە خاکو پێی نەنا پێما
دەسا خاکی هەموو عالەم بەسەر خۆما نەکەم، چ بکەم!
دەمێکە شاری پڕ شۆری مەحەببەت ماتو خامۆشە
بەقانوونی تەجەننون شۆڕشێ ئینشا نەکەم، چ بکەم!
لەچاوانم نەما بۆ گریە، نۆبەی سەجدە بەردەریە
سیا ساڵم نەبارە، نوێژی ئیستیسقا نەکەم، چ بکەم!
لەسەر تۆم دوشمنە دنیا، قەزییەم((مانع الجمع))ە
کە تەرکی تۆ نەکەم، تەرکی هەموو دنیا نەکەم، چ بکەم!
بەجێ ماوم لە یاران، نابەجێ ماوم، ئەجەل! زوو بە
بە مردن لەم قوسووری ژینە ئیستیعفا نەکەم، چ بکەم!
ئەوا لەیلا بە ڕۆژی حەشر ئەدا وادەی لیقا((مەحوی))!
هەتا قامی قیامەت، ئاەو واوەیلا نەکەم، چ بکەم!

ل: ٢٢٠

دڵم دەرهات و تۆ هەر دەرنەهاتی!
نەهاتی، هەر نەهاتی، هەر نەهاتی!
کە ئەم خەندەو قسەو لێوەت هەیە تۆ
لە باتی شەککەر و نوقڵ و نەباتی
دەدەی وا دەم بە قەتڵ ئەمڕۆ، سبەی هیچ
ئەتۆ شاهی، چییە وا بێ سەباتی!
لە دنیا جەننەتی خۆ دیوە هەر کەس
کە تۆ بێ حازری وەختی وەفاتی
ئەگەر ڕۆژە، بتی من! هەر بتێ بێ
سەرەو ژێرە کە تۆ وەک ڕۆژهەڵاتی
کە خزر ئەو خاک و خۆڵی بەردەرەی دی
وتیی: تۆ خاکی یا ئاوی حەیاتی؟!
روخیشی کردە ئەولا، دەیشیپرسیی
بەشۆخیی، شاهی من، تۆ بۆ چی ماتی!
کە داغی سینەمی دیی، دەردی دامێ
وتی: مۆرت هەیە، ساحێب بەراتی
کە شیرین و تەڕی دی شیعرەکانم
وتی: ((مەحوی)) کە میراوی فوراتی

ل: ٢٩٧

دنیا تیاترۆیە، مەوەستە تیا، بڕۆ
کێ مایەوە تیا کە نەبوو بێ تیا، تڕۆ!
دنیایەکە دوو ڕۆژە نەوازش بکا، سێیەم
ڕۆژی گودازشە، ئەمەتە داکی سێبەڕۆ
روو ترش‌و روو خۆشە لە رووێکا، لە یەک دەما
قەهری درۆیە، میهری درۆ، هەردوو هەر درۆ
پشتی کە دا بە پشتتەوە، بۆ پشت شکاندنە
ئەمڕۆ خودا شوکرتە، سبەینێ براله رۆ
پیریی نەمامی باغی جوانیمی کردە پووش
تازەم درەختی توولی ئەمەل دەردەکا چرۆ
گەردن کەچیی چلێکە سەرئەفرازییە گوڵی
بڕوانە، چاوەکەم، کە لەسەر چاوە جێی برۆ
((مەحوی))! بە ((موتوا))وە کە لە مردن ببی نەجات
رۆیاندنت لە پێشە، لەپێشا وەرە بڕۆ

ل: ٢٥٢

له مەیخانه، خودا! گەر ئێمه دەرچین
بەکێ بەین ئیلتیجا، بۆ کێهه دەرچین؟!
که ئێمه چوونه جەننەتمان به تۆ دا
له ئێمه لادە زاهید! ئێمه هەرچین
خەت و زوڵفی به یەکدا دێ لەسەر روو
مەگەر زەنگو خەتا شەڕیه لەسەر چین
له باوەشما دەدا مەوج ئەشکی حەسرەت
که مەرتی گرته باوەش تا کەمەرچین
ئەوەندە تەنگو ناخۆشه، له دنیا...
خۆشه دەرچوون، ئەگەر چی بۆ سەقەر چین
سەرت پێ لازمه، مەیبازە ((مەحوی))
دەبێ دولبەر که هات ئێمه به سەر چین
مەحالاته له بەندی زوڵفی دەرچوون
چەها چینه، چەها چینه لەسەر چین

ل: ٢٤٨

له دنیادا دڵ ئارامێک‌و ئارامی دڵێکم بوو
به جارێ ماڵی وێرانم، ئەمیشم چوو، ئەویشم چوو
خوێنی دڵ لەبەر چاوم نەبێ تاکەی رەوان ئاخر!
ئەوا ڕۆیی لەبەر چاوم ئەوی رۆحی رەوانم بوو
چ حاڵە! قوڕ بەسەر حەتتا بە حاڵم پێکەنینی دێ
بە دەست ئەتواری تۆوە قوڕ بەسەر خۆم، ئەی دڵەی بەدخوو
دڵ‌و دڵبەر لە یەک بەدخوو ترن، سا من خودا چ بکەم؟
((فلا المحبوب یرثی لی، و لا القلب الشجی یسلو))
لە ڕۆژێکی کە ئەو گوفتار توتی، کەبک رەفتارە
لە من غائیب بووە، هەر ناڵەمە وەک کۆتری حاقوو
چ رۆحێ کوشتەی ئەو بالایە، قومری داری تووبایە
((فیا طوبی لقوم فی سبیل الحب هم ماتوا))
لە دووری ئەو کوڕە فرسەتتە با زوو بمری ئەی ((مەحوی))!
مەبادا بێتەوە بۆ کوشتنی تۆ ڕەنجەکا بازوو

ل: ٢٦٢

عەجیبم دێ لە عەقڵی ئەو کەسە وا تێدەگا مەردە
کەچیی وەک خان‌و خانم دائیما دڵ خۆش‌و بێ دەردە
بە پیری مەرگەوە فرسەخ بەفرسەخ ڕۆیون مەردان
ئەوی باکی لە مردن بێ دیارە بلّحو نامەردە
لەبەر قاپی مەحەببەت ئەو خودا پێ داوەیە روو سوور
حەزینە، دیدە پڕ ئەسرینە، دڵ خوێنینە، روو زەردە
لە ئەحبابی قەدیمی بەزمی ئولفەت ماوەتن دوو تەن
یەکێ پەروانە هەم دەردە، یەکێ بولبول کە هەم فەردە
براله! ئەم هەموو ئۆباڵە بێ بەو گەردنە حەیفە
بنیشێ بەم حەدە ئەم گەردە لەو مینایی بێ گەردە
لە دەورمدا حەسار، ئافەت، لەسەر سەر خەیمە، دوودی ئاە
لە سایەی عیشقەوە بوومە شەهی ساحیب سەراپەردە
چلۆن ئەو دێتە چاوی من کە یەکسەر عونسوری ئاوە
مەحاڵە من کە بچمە دڵیەوە، دڵ کیشوەری بەردە
تەپ و تۆزی غوباری دیمو ڕێگەی گۆڕی‌و دەیوت:
دەترسم دامەنم ئاخر ببێ ئالوودە بەم گەردە
دەبینم ئەهلی دڵ یا سەنگەسارە، یا لەسەر دارە
دیاری عیشق، ئەگەر ساغت دەوێ، هەر دارە هەر بەردە
لەباغی سێوو بەیدا باسی روخسارو چەنەی کەی بوو
خەجڵ ما سێوو بەی ترسا، کەوا ئەو سوورە، ئەم زەردە
ئەگەر چیی من گەدام ئەو شا، لە عورفی عیشقدا ((مەحوی))
بەسە نیسبەت لە بەینا، من سیابەخت، ئەو سیاچەردە

ل: ٢٧٠

لە سەیری خەستەخانەی عیشق ئەوی سەوزەی کەوا شینە
لەسەر هەر خەستە دێ یا خوێندنی یاسینە، یا شینە
شەهیدی غەمزەیە بەعزێ، سەقیمی عیشوەیە جەمعێ
دیارە: سەرنویشتی ئەهلی دڵ یا شینە یا سینە
لە بەنگ ئەم بەنگییانە چی دەبینن، خۆ لە خۆ گۆڕان
لە دنیادا مەداری عەیش‌و خۆشیی، خۆ نەناسینە
بەسەر دڵدا لە قاپی فەیزەوە دێ نەشئە پەی دەرپەی
چ غەمزەی دیدە مەخموورێکە ئەمشەو کون دەکا سینە
هەناسەم دا بەناڵە عەرزی حاڵی کەم کە تاساوە
لە خوێناوی دڵ‌و جەرگم دەروونم کەیلە تا سینە
لە عالەمدا عەلامەی سوبحی حەشر ئیمشەو بەیانی دا
خودا عالم، لە چاکی ئەو بەرۆکە دەردەخا سینە
مەلا تەڵقینی ((مەحوی)) دانەدا، ((حبل المتین))ی ئەو
لە جێگەی زەللە زەیلی رەئفەتی تەهاو و یاسینە

ل: ٢٨٢

سەر کە جۆشێکی نەبێ، من زرکە تاڵم بۆچییە!
دڵ کە هۆشێکی نەبێ شیشەی بەتاڵم بۆچییە!
دەرد و داغێکی دەروونیی گەر ببێ، با ڕەنگ و روو
سیس و موغبەڕ بێ، کە ماڵم بوو جەماڵم بۆچییە!
تەجرەبەی عاشق بە سووتانی دەکرد ئەو زاڵمە
سەیری کەن ئێستا دەڵێ: مشتێ زووخاڵم بۆچییە!
پێی بە سەرمانا کە بوومە خاکی ڕێی، گەردم شوکر
گەییە داوێنی، دەلالیی بای شەماڵم بۆچییە!
داغی سینە و پێچ و تابی دوودی ئاهم خۆ هەیە
مۆر و تورەی ئینپەراتۆر و قەڕاڵم بۆچییە!
خەڵق ئەوا مەجبووری دووخۆ خستنی خەڵقن بەجان
من بە دڵ مەنفوورمە، روتبەی جەجاڵم بۆچییە!
ماڵە پیتکێنێیە ماڵ و گەینە حاڵی خۆیە حاڵ
من کەوا حاڵی بم، ئیتر ماڵ و حاڵم بۆچییە!
پڕ بە پێ زنجیری شێتی، داغی سەودا پڕ بە سەر
سەیری حاڵی خۆمە، سەیری زوڵف و خاڵم بۆچییە!
دەردەدار ئەڵبەت زوبانی دەرد و حەسرەت تێ دەگا
چاوی بیماری دەزانێ، ناڵە ناڵم بۆچییە!
دڵ گلەو شەکوەی لە ئەشکەنجەی عەزابی زوڵفی یار...
کرد و ئەو فەرمووی: ئەدی زنجیری زاڵم بۆچییە!
حاڵە بەدحاڵی لە شوێن و ماڵە وێرانی لە دوو
"مەحویا"! گەر ئەهلی حاڵی، حاڵ و ماڵم بۆچییە!

ل: ٢٩١

ئەی جەمالت نووری دیدەی ئەنبیا
شامی توررەت سوبحی عیدی ئەولیا
ئەو بەروبوومە جەنابی تۆ تیای
بەردی بۆ مە دورڕە، گەردی تووتیا
ئاوی خزرە خاکی ئەو بەرقاپییە
دڕکی ئەو بەردەرکە گوڵ، پووشی گیا
ئافتابی گرتەوە، وەک کاسە، چەرخ
سواڵی لەو ڕوخسارە بوو زەڕێ زیا
ئەهلی رەحم و فەزڵی تۆ، (مەحوی) دەخیل
سەد کەوا نائەهلە، ڕەحمت بێ پیا

ل: ٢٨

خەلاسی بوونی قەت ناوێ ئەسیری زوڵفی زنجیرت
لەبەر تیرت، مەلەک بێ، هەڵفڕینی نەبووە نەخچیرت
موژەت قوللابی گیرا، زوڵفی دلگیرت کەمەند ئاسا
مەحاڵە بەرگرێ یا بەرببێ کەس کەوتە بەر گیرت
لەناوا باسی تۆبەی تۆ بوو ئەمڕۆ ئەی ستەمگەر شۆخ
بخە ئەم تۆبە پاشی کوشتنی من، تۆ بی یو پیرت
بە دەنگی ناڵەوەم هات، ئەو دەمە ڕۆح هاتە سەر لێوم
بڵێ: ئەی ناڵە، ئاخر ئێستە من چ بکەم لە تەئسیرت
لە چینی پرچەما نووری جەبینی دی، وتی زاهید:
کە سووتا دامی تەزویرم بە نووری دامی تەنویرت
فەزیلەی ئەسڵ و فەسڵ ئینسانی پێ نابێ بە ساحیب فەزڵ
کە تۆ کۆسەی، بە تۆ چی مامە ڕیشی باب و باپیرت!
لە خاکی پاکی ئەو بەردەرکەدا گەوزا ڕەقیب، ئامان
دەری کە، حەیفە گوور ئاسن خەسارەت دا لە ئیکسیرت
لەبەر باری مەحەببەت ئاسمان و ئەرز ئەناڵێنن
چییە ئەم دەعوییەت زاهید، جلی لێ بارە گاپیرت
شوکر (مەحوی) کەوا موددێکە ناوی چووبووە نیسیان
لەزومرەی وەعدی کوشتن هاتوانا هاتەوە بیرت

ل: ٦٦

دەمت چی؟ پڕ لە دوڕ، دورجێکی یاقووت
نیشانە و مۆری چی؟ خەتتێکی زمڕووت
بەگریانم، وەکوو گوڵ، پێکەنی یار
لەباغی من بە بارش غونچە پشکووت
قوبووڵم کەی ئەگەر، لوتفێکی زۆرە
بە کەمتر هیندوێکی خاڵی هیندووت
شوکر هەر مامەوە بۆ یادگاریی
بەکاری زەخمەکەی شمشێری ئەبرووت
لە غەمزەی چاوت ئەبرۆ داگرە و بەس
مەکە بۆ قەتڵی عاشق ڕەنجە، بازووت
نەخۆشی عیشقی لێوت وەسیەتی کرد:
بتاشن داری عونناییی بە تابووت
منی بەم حاڵ و قاڵە دیی کە دەیوت:
کتێبێکی غەریبم دیوە، پەڕپووت
بە نیلە بێ نەباتی میسری لێوت
جلم. سوبحم، هەموو هەر شامە بێ ڕووت
لەناڵەی گەرمی دڵ باکت نەبوو تۆ
بەئاهی سەردی "مەحوی" من دڵم سووت

ل:٨٠

ئەم عەسرە، عەسر و وەقتە لەبۆ فاجیرێ لەهیچ
دینی نەکا ویقایە، حەیا نەیگرێ لەهیچ
دنیا بە کامی هیچ کەسانە هەمیشە دەم
هیچ ئەڵبەتە بە هیچ دەمێ نابڕێ لە هیچ
دنیا کە هیچە، جوملە دەزانن، کەچیی چ کەس
مەردانە بۆ خوادا نییە دەس هەلگرێ لە هیچ
تا سەر نەبۆتە گۆ، دە لە دنیا دە تۆ شەقێ
هەر ئەم شەقە بەکارە کەوا هەڵدرێ لە هیچ
ما چێ دەمی لەکەڵکەڵەما بوو، چ خۆشی وت:
قرم، ئەی ئەسیری واهیمە، خۆش ناکرێ لەهیچ
دەم نادیار و نازی قسەی پڕ بە دەشت و شار
دنیایەک ئاوی زیندەگیی و دەرخرێ لە هیچ
مەجنوونە: شاهی عیشق و بیابانی بارەگا
ئاهی، دەکا هەمیشە بە پا چادرێ لەهیچ
دیققەت کە، غەیری روشتەیی جان و میانی یار
روشتەم نەدیوە "مەحوی" ئەمن، بادرێ لەهیچ
چاوی کەوێ کە بەم غەزەلەم دورِ شناسی شیعر
کێ بێ دەڵێ ئەمەندە گوهەر وەرگرێ لەهیچ

ل: ٩٨

به سورمه بۆیه دولبەر خەنجەری موژگانی دا پەرداخ
دڵی هەڵناگرێ ببیێ له کوشته دەنگی ئۆف و ئاخ
بەتیرێ کوشتمیی، هەڵیاوەسیم، سووتاندمی، ڕۆیی
دوعا بۆ حیفزی کەن، کێ دیویه جانانه وا گوستاخ
گوڵ و لالەی کەژو کۆ، کۆهکەن دێنێتەوە فکرم
کەخوونی ناحەقی ئەو مەوج ئەدا ئێستەش لەکێوو شاخ
لەبەر قاپیی خەراباتا، که یاڕەب دایمه ئاوابێ
مەگەر خاکێ بەسەرداکەم، بکەم گاهێ دەماغێ چاخ
خەرابی عیشقی تۆ وا بێ سەر و سامان دەروێشه
سەری بێ تاجه، کولبەی بێ دەرە، دیواری بێ ساچاخ
نەگەینه کەعبەی ئامالە هەموو ئەسبابی ئامادە
کەدەسته: بێ عەسا، پێ: خاوسه، یەک قەتعه ڕێ: قوملاخ
لەرەشکی سەیدی فیتراکی چ شیرین شەهسەوارێکه
کە((مەحوی))! هەر وەکوو دێوانه، عەنقا کەوته شاخ و داخ

ل: ١٠٥

نەوەک هەر چاوی مەستە، خۆشی هەر مەست
بەلادا دێ، کەدێ، وەک تورکی سەرمەست
لەحەجلەی نازو ئیعزازی بە سەد ناز
خودا تۆ حافیزی بیی، هاتەدەر مەست
بە دوویا شێخ و سۆفیی مەستی عیشقی
لە ڕێیا کەوتوون مەستە لەسەر مەست
نیگاهی مەستی تا مەستانی ڕێ دا
نەما لەو جێگە ڕێگەی کەس لەبەر مەست
بنازم بەو پیاڵەی چاوی مەستە
بەیەک پرشنگی عالەم سەربەسەر مەست
لەبەر حوکمی نیگایا قاتە هوشیار
هەتا چاوی بکا بڕ، مەستە، هەر مەست
وتی: سەیری دەرو دەشتم نەماوە
لە چاوم مەوج ئەدا، پڕ دەشتو دەر مەست
بەجوز مەی ناوی ئەم ناوە بە چی بەم
بەنەشئەی ئەو بەشەر هەم "بو البشر" مەست
دەناسێ بادەکەی، مەقسوودی حەشرە
دەڵێ: "مەحوی" بنوو تۆ تا سەحەر مەست

ل: ٧٢

بپرسە حاڵم، ئیهمالی وەفا بەس
بترسە تۆ لەحەق، جەور و جەفا بەس
بەکامی غەیرو بێگانە، براله!
بەریی بوونت لەیارو ئاشنا بەس
ئیلاهیی بێ بەلابێ نەخلی بالات
بەری بۆ من بەلا بوو، هەر بەلا بەس
نزیکە مردنت ئەی پیرە زاهید
وەرە با تۆبەکەین، ئیتر ریا بەس
خودا ئەم دەردی عیشقەم لێ نەکا کەم
هەتا هەم بەس لەباتیی هەر دەوا بەس
ئەوی ئەو وێڵیە بورجی زەمینە
دە بەس بڕوا مەسیحا بۆ سەما، بەس
لەسەر تێپەڕ بووە خوێناوی جەرگم
بەسەرما بێنە، ئەی دڵ، ماجەرا بەس
کەمن دڵ پڕ کەدەرمو لێڵە عەیشم
لەکن من بەس بکەن باسی سەفا، بەس
کەنادا((مەحویا)) دادێ بەحاڵت
بەسی بێ دادو ئاەو نالە، با بەس

ل: ١٤٥

چ بکەم نە ئەو کەسەم کە کەسم بێ لەلا بەکەس
خۆشم نەگەیمە ئەو کەسە ئەو من بکا بەکەس
گەر ئیشی رۆحتە، کە نەبوو کەس بە دەستەوە
دەست هەلگرە لە رۆحو مەبە ئیلتیجا بە کەس
نا ئەهلیی ئەم ئەهالییە مەعلوومی من کە بوو
شوکری خودا، خودا بەس، ئومێدم نەما بە کەس
لێوی بە پرسشی چ نەخۆشێ نەپشکواند
دەردا! تەبیبی ئێمە کە نادا دەوا بە کەس
خورشید و سایە پێکەوە نابن، دە حەقیقەتی
ئەو جیلوە وەحشییە کە نەبێ ئاشنا بە کەس
بەس بێ سەبەب پەرستی، ئەتیببا دەوا دەدەن
بەس هەر خودا تەبیبە کە نادا شیفا بە کەس
زاهیدە وەرە روێ بکەرە بارەگاهی عیشق
عالی جەنایە، وا نییە هەر رێ بدا بە کەس
موحتاجی مەرحەمەتیە چ ناکەس، چ کەس، بە گەل
ئەو تاقە بێکەسێکە کە گرتی خودا بە کەس
جێی ئیعتیرازی کەس نیەت و نەبووە، هەر کەسێ
لادا لە نابەکار و حەزەر کا لە نابەکەس
گەر تێ بگەن لە گەوهەری دڵدا چ مەوج ئەدا،
ئەم شەوچراغە لەم شەوەدا کەس دەدا بە کەس
حەق بێژی یەک گوناهیە مونسوور و، حەقمە من
ئەم قەتعە گەر نیشانی نەدەم "مەحویا" بە کەس

ل: ١٤٦

چ خاکێ کەم بە سەرما، مامەوە تاک
بە لێو ئاهو، بە چاو ئەشکو، بەسەر خاک
بە دوویا وێڵم و ئەشکم دەپرسێ
لە هەر دارو دیارێ "این سلماک"
جگەر دەبڕێ، دڵ ئەڕفێنێت و دەڕوا
چ بێ مروەت، چ بێ پەروا، چ بێ باک
کە کوژرا، شاهی عالی جاهی عیشقە
هەتا سەیدت نەکەن ناگەیتە فیتراک
بەخەنجەر دڵمی لەت لەت کرد کەبێ ئۆف
وتی: خۆ وا خراپو دڵ وەها چاک!
نیساری خاکی ڕێگەت جانە، فەرمووی:
"چە نسبت خاکرا با عالم پاک"
گولاوو ئاگراوە بادە ئەمشەو
تەرەبناکە مەی و ساقی غەزەبناک
وتم: عیشق ئاگری گرتە وجوودم
وتی: هەر بابەتی سووتانە خاشاک
لەدڵدا خەڵق و خوا بوو، فائیدەی چی
کە دەم پڕ بێ لە "ایاک... و ایاک"
دەزانی جیفەیە دنیا، دە حەیفە
وەکوو سەگ ئەم شەڕو شۆڕە لەسەر لاک
خودا تۆ لاگری لەو لاکە "مەحوی"
بە جاهی پادشاهی تەختی "لولاک"

ل: ١٨٥

لەپڕ بەردی ئەجەل بۆ شیشەی عومرم نەوا بێ زوو
فیداتم، دەستو بردێ، ساقیا جامی شەرابێ زوو
چیە دنیا، ژنێکی هەر شەوێ سک پڕ بە سەد فیتنە
سبەینێ زوو بەخوێنی جەرگی ئەهلی دڵ دەکا بێزوو
کە دایەی خاکت ئاخر هەر دەبێ بگرێتە باوەش خۆی،
بکە خاکێ بەسەر خۆتا لە قاپی "بو توراب"ێ زوو
بە تابی عەکسی ئەو دیدارە دڵ سووتا، موزەککایە
کەتانت ڕاگرە سا زوو بەجیلوەی ماهتابێ زوو
دەنی تەبعی بە جارێ عالەمی داگرت ئەوا مەحوی!
درەنگە ئیلتیجا بە بەر دەری عالی جەنابێ زوو

زەمانەی پڕ تەعەب دەتکاتە تیرۆک
لەتێ نانت دەداتێ دوو بەشی نۆک
پاڵەی دیدە لەبڕێزە، دلا تۆش
بجۆشە، سازی ناڵە هەم ببێ کۆک
بە نووکی تیری شۆخێکی کەوا چۆخ
لەبەرما تەن بووە جامەی برنجۆک
بە کوڵمی ئاڵیا ئالا خەتی سەبز
ترنجی کەوتە بەر پەنجەی ترنجۆک
گەر ئەم ڕیش و سەرەی زاهید لەگەڵ بێ
دەبێ جەننەت بەدەشتی شنگو پیشۆک
ڕەقیبە لەعنەتی، عاشق دەکەی ڕەجم
لەباتی سەگ دەکەی شێرێ سەمەندۆک
بەخۆڕایی لە مەحوی بەس بڕەنجە
نەجیبی مەگرە، وەک هۆکڵ بەگم هۆک

ئەگەر لەیلا، ئەگەر فەرهادە، تا حەشر هەر ببن مەمنون
لە یومنی عیشقە، فەیزی حوسنە، وا بەم روتبە نائیل بوون
دەکەن ڕەشتاڵەیەکی دەشتەکی باسی لەگەڵ شیرین
دەبەن بەردهەڵکەنێکی کێزری ناوی لەگەڵ مەجنوون

له دەوری دڵمی کە دی ئەم هەموو غەمو تەعەبە
دەروونی کەیلە لە زووخاو و دەردو تا بە لەبە
وتی ببێ دڵە! وەک تۆ خراپو شیفتەحاڵ
بەڵێ هەیە لە من ئاشوفتەتر: ولاتی بەبە

بەبێ بەزمی حوزووری تۆ حەرامم کردووە بادە
نەوەک بشکێ بە نەشئەی مەی خوماری دەردی بێ تۆیی
لە میحنەتخانەکەی مندا، بەبێ تۆ هەر براڕۆیە
کە جارێ ئێوە ناپرسن لە من بۆچی برا ڕۆیی

مەحوی بوێژێک بووە لە ژیانی خۆیدا دڵتەنگ بووە.
دەڵێن هۆنراوەکانی لەسەر ڕێچکەی هیندی وتووە،
لە قووڵی بیردا، لە وردیی واتادا، لە ڕێک و پێکی
وشەکاندا زۆر هونەری بووە. زۆر بەتەنگ ئەوەوە بووە
هۆنراوەکانی کورت بن، قسەکانی لە ژێر پەردەوەبکا.

گۆران

